الحمد لله رب العالمين والا صلاة والا سلام على إمام المر سلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين أما بعد......



قال الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾(آل عمران:١٤٤)

اللّٰه تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموویت: محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەنها پێغەمبەرێک نەبووە کە وەفات بکات ، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەویش وەفاتیان کردووە ، ئایە ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید کرا ئێوە پاشگەز دەبنەوە ، هەڵدەگەڕێنەوە لە ڕێباز و دینەکەی هەر کەس هەڵگەڕێتەوە و پاشگەز بێتەوە ئەوا هەرگیز زیان بە خوا ناگات ، لە داهاتویەکی نزیکیشدا اللّٰه تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ پاداشتی سوپاسگوزاران ئەداتەوە .

ئەوانەی کە قەدری نیعمەتی ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەری خوایان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەزانی ، مردن لەسەر ئەو ڕێبازە و بەردەوام بوون.

کاتێ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەمەنی گەیشتە شەست و سێ ساڵ ، وە لە حەجەکەی گەڕایەوە چووە سەردانی گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحد وە نوێژی لەسەریان کرد وەک بڵێی خوا حافیزیان لێ دەکات ، پاشان لە نیوە شەوێکدا سەردانی گۆڕستانی بەقیعیشی کردوو و سەلامی لێ کردن و دوعای خێری بۆ کردن ، لە ڕۆژی شەممە بیست و دووی سەفەر یەکەم ڕۆژی نەخۆشییەکەی دەستی پێ کرد ، دایکمان عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە و دەفەرموویت : ڕۆژێک پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دوای ناشتنی تەرمێک لە بەقیع گەڕایەوە هاتە ناو ماڵ و تەماشای کرد من سەرم ئەهێشا دەمووت: ئای ئازاری سەرم زۆر زۆرە فەرمووی : ئەی عائیشە بەخوا سەری من زۆرتر ئەهێشێت ، بەڵام چی زیانێکت پێ دەگات

ئەی عائیشــە ئەگەر پێش من وەفات بکەی من ئەتشــۆم و نوێژت لەســەر دەکەم و دەتنێژم و دوعـای خێرت بۆ دەکەم دایکمان عائیشــە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا دەفەرموویت: کردم بە ســوعبەت وتم :دیارە مردنی منت پێ خۆشــە ئەڵێ لەبەرچاومە کە مردم دەگەڕێتەوە ناو ماڵەوە و لەگەڵ هەندێک لە هاوســەرەکانت دەبیـت ، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ زەردەخەنەیەکی کرد فەرمووی: ئەی عائیشــە بەراســتی ســەرم زۆر ئەهێشــێت دەمەوێـت بنێرم بە شــوێن ئەبو بەکردا رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ بیکەم بە جێنیشــینی خۆم ، ئیتر ئازاری نەخۆشــییەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ زۆری بۆ هێناو و زۆر زیادی کرد هەر شــەوەو لای یەکێک لە خێزانەکانی دەمایەوە ، شــەوێکیان لای مەیمونەی خێزانی بوو رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا ، هاوســەرەکانی بانگ کرد ، پرســیاری کرد لێ یـان فەرمووی: بەیـانی من لە کوێ دەبم ؟ ئەوانیش لە مەبەســتەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ تێ گەیشــتن ، داوای لێ کردن لەکـاتی نەخۆشــییەکەیـدا لەمـاڵی دایکمان



عائیشــه رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا بمێنیتەوە و ئەوانیش هەموویان ڕازی بن کە لەوێ بێت و ئەوانیش سەردانی بکەن .

دایکمان عـائیشـــه رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا دەفەرموویـت: پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ هەرکـاتێ ئـازارێکی بۆ بەهـاتـایە ســورەتەکـانی ( الإِخلَاص ، الفَلَق ، النَّاس )ی بەدەســتەکـانی دەخوێنـد و فوییپێدا دەکرد و دەیهێنا بە لاشەیدا ، بەڵام لە نەخۆشییەکەیدا دایکمان عـائیشـــه رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا دەفەرمویـت :ئەمەنـدە لاواز بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ من هەردوو دەسـتی پێغەمبەری خوام صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ کۆکردەوە و ئەو سورەتانەم بە سەردا خوێند و فوم پێـدا کرد و بە دەســتی موبـارەکی خۆی دەم هێنـا بەلاشـەیدا بە ئومێدی بەرەکەتەکەی ، تا دەهات پلەی گەرمی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ بەرزدەبوو.

فـاتیمەی کچی یەمـان رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا دەفەرموویـت: هەنـدێـک لە ئـافرەتـان چوینە ســەردانی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لە نەخۆشــییەکەیدا تەماشــا مان کرد لەرز و تایەکی زۆر زۆری

گرتووە ،کونییەیەک ئـاو هەڵواسراوە دڵۆپ دڵۆپ ئـاوەکە بەسەریدا دەتکێت بە هۆی زۆری لەرز و تایەکەی.

پێنج ڕۆژ بەر لەوەفـاتی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تـاکەی زۆر زیـادی کـرد بە هـۆیەوە دەبـوورایەوە پـێـغەمـبەری خـوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: لە حەوت بیری جیاواز حەوت گۆزەی سـەرنەکراوەی ئاوم بۆ بهێنن تا خۆمی پێ بشـۆم و خۆمی پێ تەر بکەم ، دەفەرموویت: ئاوی گۆزەکانمان دەپرژان بە دەم و چاوی موبارەکیدا ، پاشان چووە سەر میمبەرەکەی و دانیشت سـەری بە قوماشـێکی رەش بەسـتەوە لە تاو ئازاری سـەری ئەفەرموویـت: هەموو خەڵکی لەدەوروبەری دانیشـبوون دوای حەمد و ثناء ، پاشـان پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: خوای گەورە بەندەیەکی خۆی سـەرپشـک کردووە لە نێوان ئەوەی کە جوانی ژیـانی دونیـا هەڵبژێرێـت یـان گەیشـتن بە لیقـای خوای خۆی ، بەڵام ئەو بەنـدەیە گەیشـتن بە لیقـای خوای خۆی هەڵبژارد. ئەبوو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کە ئەمەی بیست لە

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی کردە گریان فەرمووی: بەدایک و باوک و ماڵ و منداڵ و سامانەوە بەفیدا و بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئەبو سعیدی خودری رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویت: ئێمە سەرسام مابووین لەم کارەی ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ خەڵکی دەیانووت تەماشای ئەو بەساڵە چووە بکەن پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ باسی پیاوێک دەکات لەبەندەکانی خۆی کەسەرپشک کراوە لەنێوان هەڵبژاردنی دونیا و گەیشتنەوە بە لیقای خوا ئەو بەندەیە لیقای خوای هەڵبژاردووە ، ئەبو بەکریش رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەڵێ ئەبینە فیدات ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

ئەبو سعید رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویت: ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ لە هەمووومان زاناتر بوو ، ئێمە نەمان دەزانی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مەبەستی لەو بەندەیە خۆیەتی ، بەڵام ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ راستەوخۆ تێگەیشت ، پاشان پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەگەر بکرایە و درووست بوایە کەسێک بکەم بە

زۆر خۆشەویست و خەلیل بۆ خۆم جگە لە اللّٰه ئەبو بەکرم دەکردە زۆر خۆشەویست و خەلیل بۆ خۆم ، متمانە پێکراوترینتان لە ناو ئێوەدا ئەبو بەکرە ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەدار بن کەسانی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەران وپیاوچاکانیان دەکردە شوێنی نوێژ و مزگەوت ، من داواتان لێ دەکەم هەرگیز کاری وا نەکەن ، پێغەمبەر ﷺ زۆر نەسیحەت و ئامۆژگاری کردن ، تا دەهات نەخۆشییەکی زیاتر و توندتر ئەبوو ، دایکمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرموویت: نەم بینیووە هیچ کەسێک ئازاری بەسەرەوە توند بێ هێندەی توندی ئازاری پێغەمبەر خوا ﷺ بەسەر نەخۆشییەکانیەوە دەفەرموویت: ڕۆژانی نەخۆشییەکانی بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد نەی دەتوانی بە پێوە نوێژ بکات.

ڕۆژی چوار شەممە و پێنج شەممەی پێش وەفاتی داوای کرد کە نوسراوێک بنوسن فەرمووی: با نوسراوێکتان بۆ بنوسم تا

سـەر لێشـێواو نەبن لە دوای خۆم بەڵام ئەوە بوو ئـازار و قەرە باڵغی ڕێگەی نەدا و نەینوسـی بە عائیشـەی فەرموو: باوک و براکەت بانگ بکە دەمەوێت نوسراوێک بنوسـم بۆ ئەبو بەکر من ئەترسم یەکێک بڵێ من شیاوترم بۆ جێنیشـنی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە ئەبو بەکر ، خوا و ئیماندارا‌ن بە جگە لە ئەبو بەکر رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ بە کەسی تر ڕازی نابن.

دەیویسـت لەدوای خۆی ئەبو بەکری صـدیق رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ ببێتە جێنیشینی خۆی و خەلیفەی.

کاتی نوێژی عیشـا بوو ئازاری پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ زۆر زیاتر بوو بە هۆیەوە نەیتوانی بچێـت بۆ مزگەوت و پێشـنوێژی بکـات فەرمووی: ئـایە خەڵکی نوێژیـان کردوە ؟ وتیـان نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ هەموویـان چـاوەڕوانی تۆ دەکەن ویستی هەستێت و بوورایەوە ، پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە و فەرمووی: ئاوم بۆ بهێنن تا خۆم بشۆم ئاوی کرد بە خۆیدا و ویستی جارێکی تر هەستێت بوورایەوە سێ جار ئەمە

لا إله إلا الله محمد رسول الله

رووپـدا فەرمووی: موســڵمانـان نوێژیـان کردووه؟ وتیـان هەموویان چاوەڕوانی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی: بنێرن بە شــوێنی ئەبو بەکردا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بـا بچێـت پێشــنوێژی بۆ ئەوان بکات ، ئەفەرمووێ : چوین زۆر گەراین ئەبـو بەکـرمـان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نەدۆزیەوه لەو کـاتەدا بە ئـیمامـی عومەرمـان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وت: پێش نوێژی بکە لە بری پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەفەرمووێت: کاتێک کە ئیمامی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ (اللّٰه أكبر)ی دابەســـت پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو ، چونکە ئیمامی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەنگی بەرز بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کوا ئەبو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دووبـارەی کردەوه ، خوا و ئیمانـداران بە جگە لە ئەبو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕازی نابن لە دوای من جێنیشینی و ئیمامەتی بکەن.

لەدوای ئەو نوێژە ئەبو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نزیکەی حەڤدە نوێژی بۆ ئیمانـداران و موســڵمانـان کرد بە ئیمامەتی ، پێغەمبەری خوایش ﷺ زیند بوو.

پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ یەک ڕۆژ پێش وەفاتی فەرمووی: چیم هەیە ببیبەخشــن لە پێناوی خوادا رەســولی خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەنها حەوت درهەمی هەبوو ئەویش هەمووی بەخشــی بە هەژاران.

لە نوێژی بەیانی ڕۆژی دوو شــەممەدا بوو دواهەمین ڕۆژی ژیانی بوو تەماشــای موســڵمانانی دەکرد کە خەڵکی لە دوای ئەبو بەکرەوە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ نوێژ ئەکەن زۆر دڵخۆش بوو ، پەردەی پەنجەرەکەی عائیشەی رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا لادا پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە بینی ڕیز ڕیز موســڵمانان لەدوای ئەبو بەکرەوە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ نوێژ دەکەن ئەوەندە دڵ خۆش بوو دڵخۆشـیەکەی بە دەم و چاوی مـوبـارەکـیـیەوە دیـار بـوو ، هـاوەڵان پـێـغـەمـبـەری خـوایـان صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بینی لە پەنجەرەکەوە خەریـک بوو لە خۆشــیـدا نوێژەکە ببرن وایـان زانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چـاک بــووەتەوە ، بەڵام پەردەکەی دایەوە ئــیــتر ئەوە کــۆتــا

تەماشاکردنی پێغەمبەرمان بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ موسڵمانان و هەوەڵانی.

فاتیمەی کچی رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا هاتە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە بینینی زۆر دڵخۆش بوو لە تەنیشتی دانیشت ، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە نهێنی شتێکی چرپان بە گوێ فاتیمەدا رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا ، فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا گریا ، پاشان فەرمووی: ئەی فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا گوێت بهێنە شتێکی تری چرپان بە گوێی فاتیمەدا رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا ، فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا پێکەنی و بزەگردی ، دواتر پێی وترا پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چی پێوتی؟ فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا فەرمووی: یەکەم جار پێ وتم ئەی کچەکەم ئەی فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا کۆتایی بە تەمەنم هاتووە تۆیش یەکەم کەسیت کە لە دوای من دەگەیتەوە پێم ، ئەفەرموویت: دەستم کردە گریان ، پاشان فەرمووی ئەی فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا تۆ گەورەی ئافرەتانی بەهەشتی گەورەی ئافرەتانی ئومەتەکەمیت دڵم خۆش بوو بەو قسەیە ، ئەوە بوو شەش

مـانگی نەبرد فـاتیمەیش رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دوای بـاوكی وەفـاتی كرد. نزیكی خۆر هەڵهـاتن بوو لە ڕۆژی دووشــەممە جـار جـار ئـازارەكەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەوەنـدە زۆری بۆ دەهێنـا لەزمـان دەكەوت و قســەی بۆ نەدەكرا تـاو تـاو دڵی دایكی ئیمانـدارانی دەدایەوە بە دایكمان عـائیشــە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەی فەرمـوو: ئـێســتـا مردن لەســەرم ئـاســانە دەزانـم تـۆ لە بەهەشــتیشــدا هاوســەرمی ئەی عائیشــە بەو جۆرە كات گەیشـتە چێشـتەنگاو ، عبد الرحمانی كوڕی ئەبو بەكر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا هاتە ژوورەوە و ســیواكێكی بەدەســتەوە بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زۆر ســەرنجی ســیواكەكەی عبد الرحمانی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەدا ، دایە عائیشــە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمووی: زانیم كە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حەزی لەو ســیـواكەیە كە بەدەســتـی عـبـد الرحمانەوەیە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، ئەفەرمووی: لێم ســەندوو و بەدەمی خـۆم تەرمـكـرد و نەرمـمـكـرد و دام بەدەســتـی پێـغەمـبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ســیـواكـی پێـكـرد ئەفەرمـووی: بە

شـــێوەیەک ئەو ســـیواکەی کرد کە پێشـــتر نەم بینیبوو پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئـا بەو شـــێوە جوانە ســـیواک بکات، پاشان ویستی سیواکەکە بەرز بکاتەوە و بیداتە دەستم بەڵام دەســـتی بۆ بەرز نەکرایەوە ســـیواکەکە لەدەســـتی موبارەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کەوتە خوارەوە.

جامێک ئاو لەبەردەستیدا بوو دەســتی پێ دا کردوو و هێنای بە دەم و چـاویـدا و دەی فەرمووو: (لا اله الا اللّٰه إن للموت سكرات ، لا اله الا اللّٰه إن للموت سكرات) بەراســتی مردن بە ئـازارە بەراســـتی مردن بەئـازارە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەســـتی بەرز کردەوە فەرمووی: (في الرفيق الأعلى) خوایە بمگەیەنە هـاوەڵانی ئـاســـمان دایکمان عـائیشـــە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دەفەرموویـت: لەســـەر شـــانم بوو پـاڵی دابوویەوە بینیم کۆکەیەکی کرد و ســـەری هات بەیەکدا ســـەری کەوتە نێوان گەردنم و سەرسینگمەوە وام دەزانی بوورایەوە چونکە پێشتر مردنی کەســـم نەبینیبوو لەبەر چاوی خۆ مدا دەفەرموو یت:

پێغەمبەری خوام ﷺ ڕاخست لەسەر سەرینەکەی و دام پۆشـــی ئەفەرموویـت: عومەر و مُغیرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا هـاتنە ژوورەوە وتیان: عـائیشـــە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ئەوە چی بووە پێغەمبەری خوا ﷺ چییەتی منیش وتم: بووراوەتەوە نەمزانی مردووە عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وتی: ئەی هاوار ئەم بوورانەوەیە چەند نـارەحەتە ئەفەرموویـت: کە هەســتـان و ڕۆیشــتن کـاتێـک گەیشتنە بەر دەرگای ژوورەکە مُغیرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وتی: ئەی عومەر پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە ، عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز نامرێت ئەوە چووە بۆ لای خوای گەورە وەک چۆن موسا چوو بۆ لای خوای گەورە داوای چـل ڕۆژ گەڕایەوە بـۆ لای ئەهـلەکەی پـێـغەمـبەری خوایش ﷺ ڕۆشــتووە و دەگەڕیتەوە ئەوەی بڵێـت مردووە بەم شـــمشـــێرە دەدەم لە گەردنی ،ئەبو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ پەیـدا بـوو فەرمـووی: عـائـیشـــە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا پـێـغەمـبەری خـوا ﷺ چییەتی وتم: ماوەیەکە بووراوەتەوە ئەی باوکە ،

ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ نزیک لاشـەی پیرۆزی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو تەمـاشـــای ڕووخســـارە موبـارەکەکەی کرد فەرمووی: بەدا یک و باوکە بە قور با نت بم بە زیندووی و مردووی هەر بۆ نت خۆشــە ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناو چەوانی پێغەمبەری خوای صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ماچ کرد فەرمووی: ئەی هاوار پێغە مبەرەکەم صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەدەســـت چوو ، ئەی هـاوار هاوڕێ تایبەتەکەم لەدە ست چوو ، ڕوومەتی لای ڕا ستی ماچ کرد فەرمووی: پێغەمبەری خوام صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەدەســت چوو ، ڕوومەتــی لا چەپــی مــاچ کــرد فەرمــووی: ئەی هــاوار خۆشــەویســتەکەم لەدەســت چوو بەدەم گریانەوە ســەری پێغەمبەری خوای صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ داپۆشی ، ئیتر هەموو ئەوانەی لەو ژوورەدا بوون زانیـان کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفـاتی کردووە و دونیا بەجێ هێشـتووە ، پاشــان ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ هاتە دەرەوە و بینی عومەر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ شمشێرێکی بەدەستەوەیە

سـوێند دەخوات کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە فەرمووی: دانیشە عومەر.

ئەبو بەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ چووە سەر میمبەرەکە و خەڵکی هەموویان ڕوویـان کـردە ئەبـو بەکـر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، ئەبـو بەکـریـش رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: ئەی خەڵکینە کەس لە ئێوە پەیمانێکی پێدراوە لە لایەن خـواوە کـە پـێـغەمبەری ﷺ نەمرێ ؟ وتیان: نەخێر هەرگیز ، فەرمووی: دەی مەگەر خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَى نەی فەرمووە: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾(الزمر:٣٠)

ئەی محمد تۆیش دەمریت ئەو خەڵکەیش دەمریت .

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ﴾(الأنبياء :٣٤)

ژیانی هەمیشەیمان نەبەخشیووە بە خەڵکانی پێش توو ئەی محمد ئایە تۆ بمریت ئەوان نامرن دەمێننەوە ،نەخێر هەرگیز نامێنن ، پاشان ئیمام ئەبو بەکری صدیق رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئایەتی ﴿وَمَا

﴿مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ (آل عمران:١٤٤)

خوێندەوە فەرمووی: ئەوەی محمدی دەپەرست بۆ محمد عیبادەتی دەکرد ئەوا محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کرد. ئەوەیشی کە اللّٰه ی دەپەرست بە تاک و بەتەنها اللّٰه زیندووە و هەرگیز نامریت .

عومەر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: واللّٰه ی تا ئەو کاتە وەک ئەوە وابوو ئەو ئایەتەم هەر نەبیستبێ کە ئایەتی قورئانە کە ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ خوێندیەوە ، ئیتر لە جێی خۆم کەوتم قاچەکانم تواناى هەڵگرتنی منیان نەما ، پاشان دڵنیا بووم کە پێغەمبەرمان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کردووە.

موسڵمانان بە وتارەکەی ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ کەمێک گەشانەوە

هەر ئەو ڕۆژە کە دوانزەی ربیع الاول بوو ،ڕۆژی دوو شەممە بوو ، ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو ، هەموو موسڵمانان بەیعەتیان بە ئەبو بەکری صدیق رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دا ببێتە خەلیفە و ببێتە جێنیشینی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دوای هەڵبژاردنی ئەبو بەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دوای نیوەرۆی رۆژی سێ شەممە دەست کرا بە شۆردنی تەرمی موبارەکی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دەفەرموویت: بوو بە مشت و مڕمان کە چۆن بیشۆین ئەوە بوو ڕێک کەوتین لەسەر ئەوەی کە بە جلەکانییەوە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بشۆین کەس ڕووی ئەوەی نەبوو کە جلی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دابکەنێ .

علی کوڕی ئەبی تالیب و عباس و الفضل و ئوسامەی کوڕی زەید و شقران کە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو ، پێغەمبەری خوایان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

شـــۆرد، ســێ جــار ئاویــان کــرد بە لاشــەی موبارەکیــدا وە پاشـان لە سـێ پۆشـاکی لـۆکەی سـپی کفنیـان دروسـتکرد، پێغەمبەری خوایان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ تیا ئاڵان.

پۆل پۆل هاوەڵانی دەهات و نوێژیان لەســەر دەکرد پاشــان هەر لەو شــوێنەی کە وەفـاتی کرد لە ژوورەکەی دایکمان عائیشـــە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا ، پێغەمبەری خوایان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ ناشـــت، چونکە پێغەمبەران پێیـان خۆش بووە لە کوێ وەفـات بکەن هەر لەوێ بنێژرێن.

ئەبو تەلحە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ دەفەرموویت: گۆری پێغەمبەری خوامان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ هەڵکەند سـەرین و جێگاکەیمان لابرد ناشـتمان ، دایکمان عائیشـــە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا دەفەرموویت: ئێمە نەمان دەزانی کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ دەنێژرێـت تـا گوێمان لە دەنگی خاکە ناز بوو ، لە نیوە شـەوی چوار شـەممەدا عباس و علی و الفضــل چونە ژێر تەرمەکەیەوە و تەرمی موبارەکیان هەڵگرت خۆڵیان کرد بەسەر تەرمەکەیدا و دایان پۆشی.

ئەنەس رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویت: کاتێک لە ناشتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەراینەوە تەواو ڕقمان لە خۆمان دەبووەوە دەفەرموویت: کاتێک کە گەڕاینەوە بەلای ماڵی فاتیمەی چی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تێ پەرین ، فاتیمە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا وتی: ئەی ئەنەس دڵتان هات خۆڵ بکەن بەســەر پێغەمبەری خوادا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئەی ئەنەس دڵتـان هـات خۆڵ بکەن بەســەر لاشــەی موبـارەکی بـاوکمـدا ، جـابر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرمـوویـت: کـاتـێـک پـێـغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفـاتــی کـرد مەلائیکەتەکان سەرە خۆشیان لەیەکتر دەکرد ،و اللّٰه ی دەنگی مەلائیکەتمان دەبیست بەڵام نەمان دەبینین سـەرەخۆشـیان لە یەکـتر دەکـر کە پـێـغەمـبەرەکـیـان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفـاتـی کردووە.

بەم شـێوەییە ئـومەتی ئیسـلام ئەم موسـیبەتە گەورەیـان بەسەر هات کە مردنی گەورە و ڕابەر و سەروەرەکەیانە.

والله ی لای ئیماندار ئەوەی کە ئیمان بەحەق لە لاشــیدا بێت هیچ موســیبەتێکی لا گەورەتر نیە لە موســیبەتی وەفـاتی رســول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەر بـۆیە خـۆشــەویســتی خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (هەر کاتێک موسیبەتێکتان توش هات بیر لە موسیبەتی مردنی من بکەنەوە تا موسیبەتەکانی خۆتان لا سەهل و ئاسان بێ)

پـێـغەمبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفـاتـی کـرد ، بەڵام دیـن و ڕێبـازەکەی و هەڵگرانی ئەو ئیســلامە تـا ڕۆژی قیـامەت هەر دەمێنن و ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی ســەر زەوەی دێنە ســەر ڕێباز و دینەکەی.

﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُــولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّــاهِدِينَ﴾(آل عمران:٥٣)

ئەی پەروەردگار ئیمانمان بەوە هێناوە کە داتبەزاندۆتە ســەر پێغەمبەرەکەت صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە شــوێن پێغەمبەری خوا و ڕێبـازەکەی کەوتووین بمـان گێڕە لەوانەی کە شــا هێـدی

بەحەقمان داوە بە وەحدانیەتی تۆ وە بە ریسالە و پەیامەکەی پێغەمبەرەکەت صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾(الأحزاب:٥٦)

خواو مەلائیکتەکان سـلاوات دەدەن لەسـەر رسـول اللّٰه دەی ئێوەیش سەلاوەتی بەردەوام و زۆر لەسەر خۆشەویستەکەتان بدەن لەسەر ئیمام و قودوە و سەروەرەکەتان.

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ, كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ, اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ )



قال الله تعالى في كتابه الكريم

إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا